لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد

# هەندێک
# لەو زاراوانەی واتایەک زیاتر ئەبەخشن



ئەندامی یاریدەر : جەمال بابان

لە بەشی یەکەمی بەرگی دوەمی
« گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد »
دەرهێنراوە

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد

بەغدا — ١٩٧٤

هەندێك

# لەو زاراوانەی واتایەك زیاتر ئەبەخشن

ئەندامی یاریدەر : جەمال بابان

پێشەكی : هەرچەندە زمانی كوردی زمانێكی دەوڵەمەند و فراوانە ، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك ناوی لە دوو شت یاخود زیاتر ناوە ، كە لە یەكەوە دوورن یا لە بنچینەدا یەكن و نزیكن بەڵام بەرە بەرە هەر ناوە لەوی تر جیا بۆتەوە و دووركەوتۆتەوە . ئەمەش گەلێك هۆی هەیە ، وەك :

١- هۆی مێژوویی : بنچینەی زاراو یا وشەكان لە رەگەزدا یەك بوون بەڵام بە تێپەڕبوونی كات و رۆژگار لە یەك دوور كەوتوونەتەوە .

٢- رێكەوت : ناو هەیە بە رێكەوت بەسەر دوو شتدا سەپاوە و هەر یەكە شوێنی خۆی چەسپاندوە وەك : كەو (باڵندە) و كەو كە لە بابەتی بێژنگە و دەغڵی پێ پاك ئەكرێتەوە .

ێ ترەوە[1] : وشـــە هەیە لە زمانی بێـــگانەوە
زمانەکمانەوە ، دە هـــەر ئەو وشەیە بە کوردی
ـاتایەکی جیـاوازی هەیە ، وەك « آذار » کە مانـگی
ـەرەبییـــەو لە کوردیدا بووە بە ( ازار ، ئازار ... ) .
اری کوردیش هەیە کە ئێشە .
ـرێ شێوە ( تعدد اللهجات ) وەك ( شواشێنك ) کە درەختێکی
بەهاری هەمیشە سەوزە گەڵای وەك مۆرد وایە ، بەرێك ئەگرێ
وەك چواله تاڵە . هەر ئەم وشـەیە لە بادینانداناوە بۆ جۆرە
ترێیەك وە بۆ جۆرە هەنجیرێـکیش[2] . هەروەها ( چای )

---

(۱) دوکتۆر عەبدولڕەحمان مەعروف لە باسـەکەیدا کە لە یەکەم کۆڕی لێکۆڵینەوەی کتێبی قوتابخانە بە زمانی کوردی لە شـەقلاوە ( ۲۵ ـ ۲۷ / ۷ / ۱۹۷۳ ) پێشکەشی کرد ، بەمەیان ئەڵێت وشەی هاوڕۆ ( مشـترك لفظی Homonym ) ، وە ئەڵێت ئەوە لەو وشانە نین کە ماناکان زۆرە بەڵـکو ئەو وشانەن کە تەنها لە خوێندنەوە و نوسیندا وەك یەکن ئەگینا لە واتا و پەیدابوندا جیـاوازن . ئنجا ئەڵێت : « وشەی ( باو ) دەبینین سێ وشەن کە ماناکان جیاوازە و لە یەك دوورن هەرچەندە هەرسێـکیان لە نەژادا کوردین ، بەڵام پەیدابون و دروست بونیـان لە ڕێـگای جیاوازەوە هاتووە . ( باو ) دەستور : فیسار شت بووە بە باو . ( باو ) باوك . ( باو ) زیادەی شتێك بەسەر شتێـکی تردا .. هتد » ( بڕوانە لاپەڕە ۱۲ ی وتاری ناوبراو ) .

(۲) بڕوانە : شیخ محەمـەدی خاڵ ، فەرهـەنـگی خاڵ ، جزمی دووەم ، سلێمانی ۱۹٦٤ ، ل ۳۲۸ .

لەناو لوڕەکاندا بە (سارد) ئەڵێن . لە هەندێك شوێنی تر چاییە کە ئەخورێتەوە[3] . ئنجا (ساو) کە بە هەتاو ئەڵێن و لە هەوراماندا بە (سێو)[4] ... هتد .

جگە لەوانە چەند هۆیەکی تریش هەن . سەیر ئەکەیت هەندێك وشە هەن لە رێگای کورت کردنەوە و سووانەوە لەگەڵ وشەیەکی تردا یەك ئەگرنەوە . وەك (بەخش) بووە بە (بەش) بە مانای (پشك ، حصة) وە هەر (بەش) لەو شێوەیەدا بە واتای (کراوە ، منفرج) دێت وەك بڵێیت (زاری بەش بووەوە) یاخود (دەمەبەشکەی پێوە نوسا) .

هەروەها جاری وا هەیە لە رێی لکاندنی ئامرازەوە بە وشە ، دوو وشەی لە یەك دوور یەك (شکل) وەردەگرن وەك (باران - بارانە) کە ناوی گۆرانیەکە و (بار - بارانە) کە باجی بار ئەگەیەنێت . لێرەدا بۆمان دەرئەکەوێت کە وشەی (باران) ئامرازی (ە) ی پێوە لکاو کردی بە ناوی گۆرانی ، کەچی وشەی (بار) ئامرازی (انە) ی پێوە لکا و واتاکەی کرد بە باج ....

لە کاتێکدا کە خۆم گەلێك وشەی لەم بابەتەم کۆکردبووەوە ، لە لایەکی تریشەوە لە تەواوکردن و راستکردنەوە و راڤەکردندا سوودێکی هێجگار زۆرم لە فەرهەنگی شێخی بەرێز مامۆستای

(3) هەمان سەرچاوە ، ل ١٥ .

(4) هەمان سەرچاوە ، ل ٢٥١ .

خاڵ وەرگرتووە ، هەروەها سوودم لە فەرهەنگی كشت و كاڵی مامۆستا شێخ مارفی قەرەداغی و فەرهەنگی مامۆستا تۆفیق وەهبی بەگ و ئەدموندس و فەرهەنگی مەردۆخ و رابەر و گەلێك فەرهەنگی تر وەرگرتوە .

بێگومان ئەمە فەرهەنگ نییە كە پێشكەشم كردووە ، هەرچەندە بە ناچاری واتای هەندێك وشەم لێكداوەتەوە ، ئەوانی تر نزیكترین هاوتا یاخود پەیوەندی پێشینان یا وتەی فۆلكلۆریم لەگەڵدا هێناوەتەوە بۆ ئەوەی زوو خۆیان و واتاكەیان دەركەون . لە دواییدا پەیوەندی بەینی وشەكان و جیاوازیانم بە ( را )ی خۆم لێكداوەتەوە ، رەنگ هەیە راست بم ، رەنگیش هەیە بە هەڵەدا چووبم یا بە لای كەمەوە كەموكوڕییەك لە لێكدانەوەكەمدا هەبێت . ئەوە داوا لە خوێندەوارانی بەڕێز ئەكەم بۆم راستكەنەوە و بۆم تەواوكەن .

| زاراو | واتاكانی | پەیوەندی یا جیاوازییان (بە رای من) |
|---|---|---|
| ئاتەشی | تووڕە و كەللەڕەق ؛ گوڵێكی سووری بێبۆن ؛ گەرمی و هێزی جنسی . | بنچینەكەی گەرمی و سوورییە وەك ئاگر . |
| ئار | ئاگر ( ئاتەر ـ لە ئاوێستادا ) ؛ ئارد ( زازا ) ؛ هێز و توانا . | لۆژانی شێوە . |

| | | |
|---|---|---|
| ئارەق | ئــاوی لەش ؛ خواردنەوە ـ مشروب . | لە زمانی بێگانەوە . |
| ئارێ | خۆڵەمێش (لە ئار ـ ئاگرەوە) ؛ ڕەگەزی ئــارێ کە کوردیــش ئەگرێتەوە و لە بنچینەدا (ئاریان)ە . | ئاریەکەی بێگانەیە تێکەڵاو بە کوردێ بووە . |
| ئازار | مانگی مارت ـ بــە عەرەبێ ( اذار ) ؛ ئێش . | مانــگەکە عەرەبییە تێکەڵاو بە کوردێ بووە . |
| ئاژاڵ | مەڕومالاّت ؛ سەوزەگیا و لەوەڕ . | |
| ئاش | شــوێنی پاکردنــ و هاڕینی دانەوێڵە ؛ چێشت . | ئاشی چێشتەکە بێگانەیە . |
| ئافێ | کشتوکاڵی ئاوێ (زازا) ؛ شەونم ؛ زەمینی بەراو . | بنچینەکەی نەڕی و ئاوە . |
| ئاگرە | شــەرا و گڕە ؛ نەخۆشــێ کشــتوکاڵ ؛ برینی دەموچاوی منداڵ . | بنچینــەکــەیان ســوڕێ و گەرمییە . |
| ئاڵ | ڕەنگی سوری کاڵ ؛ نەخۆشیەکە تۆشی زەیستان ئەبێ ( هاڵ ) سور هەڵئەگەڕێ . | لە ئاڵیبا یەکن . |

**ئـاڵا** بەیداخ (دوور نییە لە ئاڵەوە بێت)؛ قەڵەمی نوسین .
رەنگە یاخود دارەکە یەکیان ئەخات .

**ئاڵۆز** مرۆ و وڵاخی تۆرە ؛ رۆژی سارد و توش .
ئاسـایـی نەبوون یەکیان ئەخات .

**ئانیشکە** لولە و گونجی کەوانە دار ؛ دارێکی دوو پەلە لە ئامرازی ئاش .
شکاندنەوەکە یەکیان ئەخات .

**ئـاوا** ئاوەدان کردنەوە بە تایبەتی دێهات وەك : ئەحمەد ئـاوا ، عەلیاوا ( ئاڵیاوە ) ؛ رۆژئاوا ؛ ئاوا ، ئاوەها : (هکذا) .

**ئاوگرتن** نۆرە ؛ ئاو ؛ گەیشتن و خۆشبوونی میوە .
دار و درەختیش کە کەوتنە بەردان ئەوەنـدە ئـاویان ناوێت .

**ئاور** ئاگر ؛ ئاوس ( ئاوسان ) .
شوێنی ئاوسانیش گەرمە ، دوور نییە گـەرمی یەکیان بخات .

**ئاوس** ئاودز ، پەنـاو ؛ ئافرەت و وڵاخی سكپڕ .
بنچینەیان رەوینەوە وێ لەوورە بوونە .

**ئاونك** ئاورنك ، شەونم ؛ ترێی مێلاق.
دوور نییە دەنکی ترێ کە و قەترەی ئاورنگەکە پەیوەندییان هەبێت .

| | | |
|---|---|---|
| ئەسپەرە | داری کلکی بێڵ ؛ ئەگریجە . | درێژی یەکیان ئەخات . |
| بـا | هەوا ؛ هاتنە بای سەگ و گورگ<br>لە ( باه )ی عەرەبییەوە . | بە رێـکەوت . |
| بابۆڵە | پاروە نانی گەورە ؛ مەلۆتکە . | پێچانەوە یەکیان ئەخات . |
| باپێچ | پێچی سك ؛ ئەو شوێنەیە (با)<br>پێچی تیا ئەخوات . | پێچ خواردنـەکە یەکیان<br>ئەخات . |
| بـار | باری ولاخ ؛ ( ظروف ، وضع )<br>( باری فەرش : دیوەکەی ) ؛<br>بێبارێ : هــەڵپەرسـتێ ؛<br>(توێژاڵێکە ئەنیشێتە سەرلێو ) . | |
| بارانە | جۆرە گۆرانیەکە چەند ژمارەیەکی<br>هەیە ؛ ( بار ـ انە ) باجی بار ؛<br>( باران ـ ە ) : ئەبارێت . | لە رێی‌لکانـدنی ئامرازەوە<br>بوّن بە یەك . |
| بـاز | باڵیندەیەکی راوکەرە ؛ چاوگ ؛<br>هەڵبەزینەوە و خۆفرێدان ـ قفز . | |
| بازۆ | قۆڵ ؛ بەڵەك ؛ لاشیپان . | قۆڵ و لاشیپان نزیکن . |
| بـاڵ | باڵی باڵیندە ؛ پەلی مرۆ . | یەکن . |

| | | |
|---|---|---|
| باڵا | ژووروَ : بـەرواری باڵا ؛ باڵای سرۆ : ئافتاو باڵای بەرزە واتا کەڵەگەتە . | لە بەرزیدا بە یەك ئەگەن . |
| باڵە | بێلی ئاسن ؛ دەستکێشی چەرم . | |
| باڵەبان | بازی تەوار : مێینەکە ؛ ئێستری زەلام و قەڵەو ؛ پارچەیەك لە پارچەکانی مۆسیقا . | |
| بـانە | ئەو بەشـەیە جوتیار وەردی ئەداتـەوە بۆ تۆو کە ڕۆژە جوتێـك یاخود گاوخانێکە ؛ بەرزایی ناو دوَ دێراو ؛ ئاڵف جاڕ . | هەموی پەیوەندی بە ئاژاڵ و کشتوکاڵەوەیە . |
| بـاو | عادەت ؛ باوك ؛ باوی شـتێك بەسەر شتێکی تردا . | ڕێکەوت . |
| باوی | بادەم ؛ بادار . | گۆڕانی شێوە . |
| باهۆ | شـان و قۆڵ ؛ ئاسۆ ؛ داری چوارچێوەی دەرگا و پەنجەرە . | بە ڕێکەوت . |
| بڕبڕە | ئێسکی تێهەڵکێشی مۆرەغەی پشت ؛ نەتەوەی ساغی تیرەیەك ؛ | لە تێهەڵکێشان و هـاتنی بـە دوای یـەکدا یەکن داسەکە نەبێت . |

| | | |
|---|---|---|
| | داسێکی بچکۆلەی کەوانە دارە وەك مشار . | |
| بۆشت | پێت و بەرەکەت ؛ توانا و لێهاتن ؛ تیژیی تیغ و مەقەست . | بۆشت یەکیان ئەخات . |
| بۆك | بنج و لاسکی کاڵەك و شوتی و ترۆزی ؛ قرقێنە . | |
| برك | قزێدان و هەوادان ؛ کۆڵنج . | زۆری شێوە . |
| بۆە | کەڵبەی بەراز ، یەکانە ؛ کەڵەمێرد ؛ کچ ؛ گۆترە ؛ بەیارێکە لە زەوی لە ناو دوَ وەردا . | بە رێکەوت . |
| بز | (بزن) ؛ چاوی بز ؛ ماستی گەورە (بە عەرەبی) . | بە رێکەوت . |
| بزکان | بزکاندنی شیر و ماست ؛ بزکاندنی قسە : قسەی بێجێ . | |
| بزە | زەردەخەنە ؛ بزەی چاو . | پەیوەندییان بە باری دەموچاوەوەیە . |
| بست | پێوانە دەستێك بە پەلی ؛ بلۆسکی ئاش . | پەیوەندییان بە مشتەوە هەیە . |

| | | |
|---|---|---|
| بلْق | بلْقی ئاو ؛ بلۆقی سوتاوی . | یەكن . |
| بلوێر | بلوێــری بێشـكەی مـناڵ ؛ پارچەیەكی موسیقایە وەك شمشاڵ . | هەر دوو بلوێرن . |
| بناوان | بناوانی ئاو ؛ ئافرەتی گەورە و سەرپەرشتیكەر لە ماڵدا . | هەر دوو بنچینەن . |
| بنە | گای گێرە ؛ سـوكەماڵ كە ئەبرێت بۆ سەر رەز یا هەوار . | هەر دوو بنچینەن . |
| بۆز | دێز ، خۆڵەمێشی ؛ سـەر و ریشی ماشوبرنج . | لە رەنگدا یەك ئەگرنەوە . |
| بۆق | قورباقـە ؛ هـالاو و هەڵمی گەرم . | رێـكەوت . |
| بۆڵ | دەنك و هێشـوی ترێ ؛ زەنگی ملی ئاژاڵی پێشەنگ ؛ خۆڵەمێش . | دوانیـان لە بەربونـەوەدا یەكن . |
| بوك | ئافرەتی تازە شـوكردو ، ژنـی كوڕ ؛ بوكی شوشە یا پەڕۆ ؛ گولاڵە سورە . | لە جوانیدا یەك ئەكەون . |
| بوم | قـوم ( قدوم ـ عەرەبـی ) ؛ بەرهەمی زەوی و زار . | ئەنجام و بەرهەم یەكیان ئەخات . |

| | | |
|---|---|---|
| بیر | (بئر ـ عەرەبێ) ؛ بیر و هۆش . | قوڵێ نزیکیان ئەخاتەوە . |
| بەر | بەری دار و درەخت ؛ پێش ، بەردەم ؛ خوار مۆسڵمدان . | ڕێکەوت |
| بەرگ | کاڵا ، جل ، بەرگی کتێب ؛ گەڵای دار و درەخت و سەوزایێ . | |
| بەرماڵ | بەرماڵی نوێژ ؛ بەردەرگای ماڵ . | لکاندنی ئامراز . |
| بەران | نێری مەڕ ؛ مژان . | ڕێکەوت . |
| بەڕە | قایشی پێش سنگی وڵاخ ؛ نەتەوە ؛ وتەی جۆتیارە بە گاجۆت کە لە هێڵ دەرئەچێت . | ڕێکەوت . |
| بەز | چەورێ ؛ دەرگا . | |
| بەزاندن | کۆڵ پێدان ، بەزاندنی مێزی منداڵ لە بلوێرەوە . | ڕێکەوت . |
| بەزین | دابەزین ؛ خستنی ماڵ و کۆچ ؛ بەڕینی وڵاخی بەرزە . | هەردوکیان دابەزینێ تیایە . |
| بەست | روبارێکە لە زێ بچوکتر ؛ حەماڵی خانوَ (زازا) ؛ شێوی وشك کە ئاوی لێ ئەبڕێت . | روبار و شێو نزیکن ، حەماڵی خانوەکەش زۆرێ شێوەیە . |

| وشە | واتا | تێبینی |
| --- | --- | --- |
| بەستن | مەیینی ئاو ؛ گرێ لێدان ؛ بەستنی زاوا لە پەردەدا . | ڕێکەوت . |
| بەق | ئێرەکەو ( هەورامی ) ؛ بۆق ( بادینانی ) . | گۆزانی شێوە . |
| بەل | چاو بەل ؛ ئافرەتی چاو لە دەر ؛ بزنی گوێ لوول ؛ بەلە بەل : تەکە تەك . | لام وایە جولاندن ( حركة ) یەکیان ئەخات . |
| بەڵەك | بازوَ ، ڕەش و سپی ؛ نەخۆشی پێست ؛ بەڵەك چاو : چاو ڕەش و سپی تەواو . | : ڕەش و سپی ، یا سوور و سپی یەکیان ئەخات . |
| بەن | خوری ڕێسراو ؛ داری قەزوان ( دارەبەن ) ؛ دەور و پشتی دێ ( زازا ) . | گۆزانی شێوە . |
| بەندك[5] | پەت ( بادینانی ) ؛ بۆیماخ (زازا) ؛ گیایەکی بۆنخۆشە تێکەڵاو پەنیر ئەکرێت ( زازا ) . | گۆزانی شێوە . |
| بەنك (زازا)[6] | پەتی ژێرچەنەی ژنان ؛ بەنی | بەنی ژێر چەنە و بەند یەکن. |

(٥) فەرهەنگی خاڵ ، جـزی ( ١ ) ، لاپەڕە ١٧٦ .

(٦) سەرچاوەی پێشوو .

ڕێسراو ؛ درەختی قەزوان (دارەبەن) .

**بەنك** [٧] (مخدر) بۆ كێشـان ؛ نیشان (زازا) ؛ كات (زازا) . — لۆزانی شێوە .

**بەیار** زەوی نەكێڵراو (بـــور) ؛ (عاشق) : كێ بكرم بـە یار شێوەی لە تۆ بێ . — یەكگرتنی دوو وشە .

**بەور** بەبر (جۆرە پڵنگێكە) ؛ بەفر . — ڕێكەوت .

**بێچو** ســـاوای گیاندار ؛ دراوێكی زێوینی بچكۆلەیە . — لە بچوكیدا یەكیان گرتووە .

**بێخ** بنـــك ؛ كوڵێكی جوانی كوێستانییە .

**بێز** قێز ؛ ڕەنگ : ڕەنگی فەرش و قاڵی یا قوماش (شەیتان بێزی) . — ڕێكەوت .

**پاتاڵ** پەڕۆ و پاتاڵ ؛ مەردوومی بێكارە . — لە بۆسوودیدا یەك ئەگرن .

**پارە** دراو ؛ پارچە ؛ هەلاهەلا .

**پارێز** دەمگێڕانەوە لە خواردەمەنی ؛ خۆلانانەوە لە پارێزدا لە ڕاوا . — خۆگرتن .

---

(٧) سەرچاوەی پێشو .

| | | |
|---|---|---|
| پاشبەند | زنجیری پاشـــبەندی وڵاخ ؛ پاشبەندی رست . | هـەردوكیان لە دواوە بەكارئەهێنرێن. |
| پاشەبەرە | دواسكی ژن و دوا منداڵ ؛ دوا بەری بێستان . | دوا بەر . |
| پاڵانچە | ماسولكەی گۆشتی ئەملاولای مۆرەغەی پشت ؛ بەرد و قوڕ و قسڵ كە ئەدرێنە پاڵ گونجی ئاو ؛ ئەو خوریەیە كە لەسـەر پشتی بەران ئەهێڵرێتەوە دوای بڕینەوەی . | یەكەم و دوەهەم ئەو شتانەن پاڵ ئەگرن . |
| پاڵتو | پارچەیەكی پانە لە كورتاندا ئەكەوێتە ژێر كلكەوە ؛ دارێكە ئەدرێتە بـــەر نۆی ئاش بۆ نەجوڵاندنی ؛ پەراسو . | بـەكارهێنانیان بۆ چەسپ كردن و پاراستنە . |
| پانتۆڵ[8] | European - Style Trousers پانتۆڵی لەبـەر كردن لەگـەڵ چاكەتدا ؛ Pendulum پندۆڵی سەعات . | بێلانەن و رێكەوت نزیكی ختونەوە . |

(٨) فەرهەنگی تۆفیق وەهبی ، لاپەڕە ١٠٢ .

| | | |
|---|---|---|
| پانکە | باوەشێنی کارەبا ؛ جۆرێکە لە ماستی : ماسییە پانکە ؛ بەری داری مازوو . | رێکەوت و تێکەڵاوبوونی وشەی بێگانە . |
| پایە | (منصب) ؛ پایەی دیوارو خانوو . | یەکن . |
| پرك | توێژێکی سپییە لە شتی شل پەیدا ئەبێ ؛ پەڵـەیەك زەوی یا دەغڵ ؛ بڕێك ئاژاڵ . | رێکەوت و گۆڕانی شێوە. |
| پشت | لە مل بەرەوخوار تا سەر سمت ؛ ئەرخە ؛ باوك و باپیر . | هێز و یەکبوون یەکیان ئەخات. |
| پشك | بەش : بەشی خەرمان و بەشکردنی شتی تر ؛ پشکی کوندە و مەشکە و هێزە ئەو چیلکەیەیە کونەکانیان ئەگرێت . | لە هەردووکیاندا هەر چیلکەکەیە . |
| پل | پلێك گۆشت : کوتێك ؛ پەنجە . | نزیکن یا خود یەکن . |
| پلە | پلەی پەیژە و قاڵدرمە ؛ پایە . | یەکن . |
| پلار | توانج ؛ کورتە دارە کە بهاوێژرێت . | یەکن . |

| | | |
|---|---|---|
| پزۆ [9] | پـزۆی دەرپێی کـوردی ؛ دەردێـکە توشی مـەڕ و بزن دێت وەك هەلامەتی ئادەمیزاد ؛ دەمی ڕەشکەی کاکێشان . | یەکەم و سێهەم لەیەك ئەکەن . |
| پۆپ [10] | پۆپنەی کەڵەشێر و مریشك ؛ قژی ئافرەت . | یەکن . |
| پۆز | لوت ؛ (هەوا و غرور) . | یەکن لە لوت و لوت بەرزیدا. |
| پەپکە | گونـکە هـەویر ؛ خـەرواری هەنجیر و پەتیر ؛ خۆپێچانەوەی مار . | یەکن لە نەرمی و کۆیی‌دا . |
| پەپولە | (فراشە) ؛ پەروانە . | یەکن لە سوڕانەوەدا . |
| پەتڵە | ساوەری نەهاڕاو ؛ دانەوێڵە . | یەکن . |
| پەچە | هاوەڵی عەبا ؛ پەچەی گاگەل یا ئاژاڵی تر : ئەو شوێنەیە لە دەرەوە مۆڵی تیا ئەخۆن . | یەکەمیان بێگانەیە . |
| پەڕ | پەڕی باڵندە ؛ کەنار ، ئەو پەڕ یا ئەم پەڕ . | ڕێـکەوت . |

(٩) فەرهەنگی خاڵ ، ج١ ، ل ٢١٥ .

(١٠) سەرچاوەی پێشو .

| | | |
|---|---|---|
| پەڕە | پەڕەي كاغەز ، پەڕەی پەروانە ؛ پەڕەی لوت و گوێ و دڵ ؛ گەڵای دار و درەخت . | یەکن لە تەنکییا . |
| پەردە | پەردەی گوێ ( غشاء ) ؛ پەردەی پەنجەرە ( ستائر ) . | یەکن لە تەنکییا . |
| پەڕین | هـەڵاتنی وڵاخی نێر لە مێ ؛ ترازان و دەرچوونی شت ؛ لە گۆ چوونی ئەندام . | ڕێکەوت[1]. |
| پەشم | قسەی بێ نرخ ، گاڵتە ؛ خورت . | ڕێکەوت . |
| پەڵخ | گوێرەکەی گامێش ؛ پەڵخـــە بەراز : بەچکەی بەراز . | بەچکەی زل و قەڵەو لە چاو بەچکەی تردا . |
| پەل | چوارپەلی وڵاخ : هـــەر دوو دەست و هەر دوو قاچی ؛ لق و پۆپی دار و درەخت ؛ بڵاو ، فراوان . | |
| پەڵە | نوخشە باران کە زەوی تێر ئاو ئەکات ؛ لەکە ، کە ئەکەوێتە سەرجل و قوماش ؛ پەڵەزەوی یادەغل : پارچە . | هەموو ڕیتێن لە کەم لەچاو زۆردا . |

| | | |
|---|---|---|
| پەنا | هـانا (استنجـاد) ؛ كـوچە (زاویە) . | رێكەوت . |
| پەند | (درس ، عـبرة) ؛ پەند و پەنـگ (بەدناوێ) . | یەكن لە (دەرس) وەرگرتندا . |
| پەی | (تأمینات : پەی لەسەر دانان) واتا پێ داگرتن لە (مزایدە یا مناقصە)دا ؛ شوێـن : پێی هەڵـگرتووە ؛ رێ و ماوە ؛ ئاوەكە پەی ئەدا بۆ لێدان . | بۆداگرتن یەكیان ئەخات . |
| پۆل | (صف) ؛ پۆلی باڵیندە . | یەكن لە زۆرێدا . |
| پوڵ | فلس ؛ (طابع) . | ئەوسا نزیك بوێن لە نرخ و وێنەدا . |
| پێ | قاچ ؛ پەلەپیتكەی تفـەنـگ ؛ پێی ئاش : ئەو دارەیە بەرداشی پێ ئەجوڵێنرێت . | هەموێیان بۆ جولاندنن . |
| پیر | پیاوچاك : پیرمەسوێر ، پیرخدر ؛ بەساڵاچوێ . | یەكن . |
| پیرەلۆك | پنربوێنەوەی ئەندامی لەش لەبەر مانەوەی لە ئـاوا ؛ داری گەندەڵ . | یەكن . |

| | | |
|---|---|---|
| پیتك | چەکوشی قورسی ئاسن ؛ فیقەنە ؛ لاسکی گەنم و جۆ . | ڕێکەوت . |
| پێڵە[۱۱] | قۆزاخەی کرمی ئاوریشم ؛ گاجۆتێکە شاخەکانی بەلای گوێچکەیدا شۆڕ بۆبێتەوە ؛ پێڵۆ ( ئەردەلانی ) . | گۆڕانی شێوە . |
| تاپۆ | قەباڵەی بەخاوەن بوونی زەوی و خانوو ؛ تارمایی شت . | یەکەمیان بێلانەیە و بە ڕێکەوت ناوەکانیان لەگەڵ دوەمدا یەککەوتوون . |
| تات | تەلە بەرد ، شاخ و کێوی سەخت ؛ ئەو ئافرەتەیە ئێسقانی کزکزاگە یا پارچە گۆشت لە زێیدا هەبێت . | لە ڕەفتیدا یەك ئەگرنەوە . |
| تار[۱۲] | تاریك ؛ پارچەیەکە لە پارچەکانی مۆسیقا ؛ گیاندارێکە تەرە بوبێت . | ڕێکەوت . |
| تاق | کەلەبەرێکی کەوانەییە لە دیواردا شتی تیا دائەنرێت ؛ کات ؛ تاق پێش نیوەڕۆ ؛ تاك ؛ پێستی مەڕ و بزن . | ڕێکەوت . |

(۱۱) فەرهەنگی خا ، ج۱ ، ل ۲۵۹ .

(۱۲) سەرچاوەی پێشوو .

| | | |
|---|---|---|
| تاڵ | تـامی تفت و ناخـۆش ؛ تاڵ ـ دانی مەشکەو شتی تر : خۆشە کردنیان بە جەوت و توێـکڵە هەنار و مازوَ ؛ تاڵ ـ ەدەزوَ : هەودا ؛ پارچەیـەك گۆشـتی رەشە لە ناوەندی سیوجگەردا . | تاڵی هەموویان یەك ئەخات ، تاڵە دەزووەکە نەبێت . |
| تام | رۆنی چێشت ؛ ( طعم ) . | یەکن . |
| تانە | خاڵێـکی سپییە لە سەر گلێنە ؛ نیشـــانەی پێ گەیشتنی میوە ؛ تەشەر ( طعن ) . | رێکەوت . |
| تاو | تاو ـ ە دەزوَ : تاڵە دەزوَ ؛ تاو ـ ە باران : لێزمەیـکەم ؛ تاو ـ ێك ( بۆ کات ) دەمێـکی کەم ؛ تاو ـ ی سەندووە : گەرم بووە و گوڕی سەنـدووە ؛ تـاو ـ ی داوە : تینـووە ؛ تاو ـ دانی وڵاخ : غارپێ کردنی . | زەبر هەندێکیان ئەگرێتەوە ، ئەوانی تریش رێکەوتن . |
| تەرازوَ | ( میزان ) بۆ کێشانی شتومەك ؛ تەرازوَی ( بەنا ) کە رێـکتی پێ ئەپێوێت ، چەند ئەستێرەیەکن | لە کار و دیتمەندا یەکن . |

| | | |
|---|---|---|
| | لە بەینی کۆ و گەلاوێـژدا لە تەرازوو ئەکەن . | |
| تاوڵە | تەویلەی وڵاخ ـ پشـت تێر ؛ جۆرە یارییەکە بە پوولی تەختە و زار ئەکرێت . | بێگانەن ، بە رێکەوت لەیەك ئەچن . |
| تاوێر | تاشە بەردی شێنکار ؛ ئەندازەیەکە لە برێشکە یا کەشك کە لە ناو ساجدا ئەبرژێنرێت . | |
| ترۆکاندن | هەڵبزین و جـوڵاندنی پێڵوی چـاو ؛ دەسـت هێنـان بە پەلەپیتکەی چەکدا بێ فیشەك ؛ کون کردنی هێلکە لە لایەن مریشکەوە ؛ دەرهێنـانی تۆو کولەکە و تۆو بێستان بە دان . | کردنەوە هەندێکیان یـەك ئەخات . |
| تریفە | شەوقی مانـگ ؛ نەخۆشـییەکی ئاژاڵە سییەکەی ئەنوسێت بە لای ورگیەوە ؛ جۆرە دەردێـکە لە تینوێتییەوە توشی ئاژاڵ و وڵاخ ئەبێت ریخۆڵەی رەش ئەکات . | دوهەم و سێهەم یەکن و بە رێکەوت لەگەڵ یەکەمـدا یەکیان گرتووە . |

| | | |
|---|---|---|
| تۆپ | تۆپی یاری Football ؛ تۆپی قوماش ؛ تۆپی شەڕ ( مدفع ) ؛ تۆپی بەردانی گونج : دارێکە پەڕۆ بە سەرەکەیەوە ئەبەستن . | قەوارە و گردی یەکیان ئەخات . |
| تۆراخ | تۆراخی ماست و دۆ : توندبونەوەیان لە تورەکەدا ؛ هێزە ، مەشکە . | هەموو دەفرەکانیان وەك یەکن. |
| تورت | تورتی توێکڵە هەنار : تفتیەکەیەتی ؛ شتێکە لە شکانا زۆر بپەڕێت . | |
| تۆڕ | تۆڕی راوە ماسی ( شبکە ) ؛ وڵاخی تۆڕ : بزێو و جوتە وەشێن یاخود تورە ؛ پەردەیەکە بەسەر چاودا ئەکشێت لە چاو پەشەوە پەیدا ئەبێت ؛ تۆڕی لۆکس : کیسەکەیەتی . | تۆڕەیی وڵاخەکە نەبێت ئەوانی تر لە بنجینەدا لەیەکەوە نزیکن . |
| تۆز | تۆز ـ و خۆڵ ؛ گەرد و وردە خۆڵ ؛ تۆز ـ یلك : بەشێکی کەم . | یەکن . |
| تۆش | رۆژێکی تۆش : تۆف و | یەکن . |

| | | |
|---|---|---|
| | سارد و سەخت ؛ ڕێگای سەختی قەد شاخ ؛ ئێستر و وڵاخی نارەحەت . | |
| تۆتە | پەنجە پچکۆلەی دەست و پێ : تۆتە ، ڕای تۆتە ، باڵابەرزە ، دۆشاومژە ، ئەسپێ کوژە ؛ تۆتە ـ لە سەگ . | لە بچوکیدا یەك ئەگرنەوە . |
| تۆر | تۆر و شێلم ، ترپ ؛ جەواڵی بچۆك . | ڕێکەوت . |
| تێل | چاوی مەیلەو خێل ؛ تێل ـ ی هەڵهات . | ڕێکەوت . |
| تەبارە | تەبارەی شینایی : دەغڵی نەدرواو ؛ کێشە ، شارا ؛ تەبارەی ناو زەوی : کەڵەکە بەردە و نیشانەیە بۆ جیاکردنەوەی دوو زەوی . | لە قەوارە و پەیوەندی بە زەوی و کشت سازیدا یەکن. |
| تەبەق | لەنگەری : سینی تەختە ؛ نەخۆشیەکی ژێر ممی وڵاخە . | ژێر ممی وڵا خیش چاڵە وەك چاڵی لەنگەری؟ |
| تەپکە | تەپکەی ڕاوی چۆلەکە و | |

| | | |
|---|---|---|
| | سوێسکە ، گەمژە : شیاکە و ڕیخی وشکەوەبوی ئاژاڵ لە گەوڕدا . | |
| تەتەڵە[13] | تەتەڵەی برنج : هەڵتەکاندنی لەسەر سینی یا لەنگەری ؛ تەتەڵەی سمت : کلۆك ؛ ڕوَمەت (ئەردەلانی) ؛ سێبەندە (هەورامی) . | گۆزانی شێوە . |
| تەژە | تکە ، سابرێن ؛ رایەڵی بن میچی خانو ؛ مرۆی زەبەللاح . | ڕێکەوت . |
| تەرس[14] | پیسایی ماین و ئەسپ ؛ کاری پێچەوانەی نالەبار ؛ (ئەم کارە تەرسی هاتووە) . | |
| تەرم | تەرمی مردوَ : لاشەکەی ؛ کۆڵێتی مێو ؛ دارە مەیت . | تۆ بلێی هەموی لە کەوتن و درێژبونەوە نەهاتبێ ؟ |
| تەقلە | تەقێلە : کڵاو ؛ کەڵبەی هەنجیری نەگەیشتو . | |

(١٣) فەرهەنگی خاڵ ، ج١ ، ل ٣٠٤ .

(١٤) سەرچاوەی پێشو .

| | | |
|---|---|---|
| تەکیە | تەکیەی شێخ : شوێنی نوێژ و یادی یەزدان ؛ بارێکە سەکۆ . | لە بنچینەدا لە ( سەکۆ ) کە وە هاتووە . |
| تەم | تەم و مژ : هەڵمی زەوی تەڕ یا ئاو ؛ لێڵایی چاو ؛ خەم . | لە بیر خەریك کردن و بەر چاو گرتندا بەکن . |
| تەمەڵ | تەوەزەل و بێکارە ؛ بناغە و بنچینەی دیوار . | تـۆ بلێی لە قورسـتیدا بەکنەگرنەوە ؟ |
| تەوس | قسـەی بە ماناو پلار ، تانە و لۆمە ؛ بەتەوسەوەچوون : جۆرە بێهۆشییەکە بەسـەر ئادەمیزادا دێت بەهۆی ڕوداوێـکەوە . | کارتێ کردن یەکیان ئەخات؟ |
| تێبەردان | تێبەردانی کار و بەرخ بۆ مژینی دایکیان ؛ تێبـەردانی سەگ و تانجی بۆ گیانی نێچیر ؛ پەڕینی نێـر لە مێ لە کاتی تەڵەبدا . | لە ڕزین و بەکگرتندا یەك ئەکەون . |
| تێچاندن | بۆی تێچـاند : قسـەی خراپی دەربارەکرد ؛ تێچاندنی شتێـکی ورد بۆ ناو شتێـکی شـل کەم کەم تاکو تێـکەڵ ببێت . | بەکن . |

| | | |
|---|---|---|
| تێز | دەفر : جەواڵە و دەمی لـــە ئەنشتیەوە ؛ سەرۆی مۆزەوەبۆ ( ئەردەلاَنی )[15] . | گۆزانی شێوە . |
| تیرە | هۆز ، ئێل ؛ تیرەی بن كڵاش ، سێرمە یاخود رایەڵەكەی ژێریەتی. | گۆزانی شێوە . |
| تیرەشان[16] | شانەی هەنگوێن هەنگ لەسەر لا هەڵی بەستبێ ؛ تیرەشـانی شاخ و كێو : درێژایی تەوقە سەر و پۆپەكەی . | لەیەك بنچینەوە هاتون . |
| تێكەوتن | تێكەوتن لە یاریدا : دۆڕاندنیەتی ؛ چونە ناو ئاو ، وسڵ دەركردن ؛ بۆت تێئەكەوم: بۆت تێئەكۆشم . | |
| تیر | تیری كەوان ؛ تیری مەرەزە : گوڵەكانی . | لە درێژیدا یەكن . |
| جاخ | جاخە توتن : تورەكەیەكە لـە گونیە یا مشەمما ؛ دیوارێكە لە دار دروست كرابێت . | رێكەوت . |

---

(١٥) فەرهەنـگی خاڵ ، ج١ ، ل ٣٢٨ .

(١٦) فەرهەنـگی كشت و كاڵ ، ل٩٦ ،

| | | |
|---|---|---|
| جاڕ | جاڕدان : بانگەواز بە گەڕانەوە ؛ جاڕە گەنم : پەرێزەکەیەتی دوای دروێنە ؛ زەوێ سەختی نەکێڵراو ؛ نێرگسەجاڕ : شوێنی نێرگس . | هەمۆیان لە سەرچاوەیەکەوە هاتوٚت جاڕدانەکە نەبێت . |
| جام | جامی ئاوخواردنـــەوە ؛ جامی شۆشە : تەبەقە شۆشە ؛ جامی رەسم : (عکس)یەتی . | بێـگانەیە . |
| جامباز | فرۆشیاری دەستگێڕ ؛ فێڵباز و تەشقەڵەکەر . | یەکن . |
| جرتوە | دەنگە دەنگی چۆلەکە ؛ ورشەی ئەستێرە . | |
| جقە | جقەی کەڵەشێر : پەنجەیەکی زیادە کە بێر بۆ لە پێی دەردێت ؛ فشە کڵاونە ، شوان خەڵەتێنە ؛ زیادە پەڕە بەسەر باڵیندەوە . | شتێکی زیادە لە پەلـەور دەردێت . |
| جوجکە | جۆجەڵە ، جۆجە ؛ کلێنجکە : کلکی ئاژاڵ و حەیوان . | |
| جۆت | کێڵاندنی زەوێ ؛ دۆ . | زەوی کێلانەکەش بـە جۆتێك گایە : یەکن . |

| | | |
|---|---|---|
| جۆتە | جۆتەی وڵاخ : لەقە هاویشتنی بەپاشۆی ؛ دوَ گیاندار بەیەك سك بین : توأم ؛ ئەو وڵاخەیە دوَشـــا رەگ لە ناو چەوانیا بەرزبۆبێتـەوە ؛ دراوێکی زیوینی ئێرانییە بە دوَ قرانـ ئەچێت . | هەموَ لە (جوَت)دا یەکن. |
| جەخت | جەختی هێنا : دوَ جار پژمێ لە کاتی قسەدا کە نیشانەی باشییە ؛ هەوڵ و کۆششی لەسەریەك بۆ کارێك ؛ ئێوارە وەختە ؛ جرین بە جەختە ( بەگوڕە ) . | دەستدانە ئیـش بەهکیان ئەخات . |
| جەنجەڕ | جەنجەڕی خەرمان کوتانـدن ؛ چەرخی ئاو هەڵـگۆزین لە بیر . | لە سۆرانەوە وە هاتوَن . |
| جەوهەر | گەوهەر ؛ بە جەوهەر : تواناو لێهاتوَ ؛ خاڵ و نیشانی دەمی خەنجەر . | لە نرخدانا یەکن . |
| چاخ | هاوچاخ : هاوکات ؛ ئـاژاڵی قەڵەو ؛ شتی ساز و لەبار ؛ تاف. | رێـکەوت . |

| | | |
|---|---|---|
| چارۆکە | خامی خومکراوی شتین بۆ کۆڵوانەی ژنە لادێیی ؛ منداڵدان ، پزۆ ؛ گیایەکە وەك بامێ گوڵێکی زەرد ئەگرێت . | رێکەوت . |
| چاڵمە | سەعاتی چاڵمە : سەعاتی گەورەی ناو چوارچێوەی تەختە بە دیواردا هەڵئەواسرێت ؛ کێسە توتنی نێرگەلە (ئەردەلانی)[۱۷] . | گۆزانی شێوە . |
| چاو | ئەندامی بینین ؛ تۆڵی تەڕ کە پێچرابێت بە شتێکدا . | رێکەوت . |
| چاویلکە | عەینەك ؛ برینێکە لە لەش پەیدابوبێت و چاوگەی داکوتبێ . | رێکەوت . |
| چڵپە | دەنگی ئاوخواردنەوەی سەگ و پشیلە ؛ چڵپاندن : جەکاندنی مەمك و گوان ؛ چڵپ و لێس : لستنەوە و هەڵ لوشین : پۆرە فەرەنگێز ، بەشەکەی خۆی | لە بەکار هێنانی دەم و زماندا یەك ئەگرن . |

(۱۷) فەرهەنگی خاڵ ، ج۲ ، ل ۱۰ .

ئەدا بە نیوە ڕێس ، خۆشی بەر
ئەبێتە چڵپ و لێس .

**چلۆرە** سەهۆڵی زستانە بە گوێسوانەدا شۆڕ ئەبێتەوە : نەسرین گوڵی زستانە ، شەوچرای كوردستانە ، چلۆرەی گـــوێ گوێسوانە ؛ جۆرە خواردنێـكی ســـارد و شیرینە لە شیر و شەكر و بەفر دروست ئەكرێت بۆ هاوین .
بەكن .

**چنگنە** گیاندارێـكی ورد و بە ئاڵۆشە ئـەداتە بنـكی متوی چڵـكن ؛ گیایەكی گەڵا وردی ریشەدارە .
لە ئاڵۆشداندا یەكن .

**چۆك** بەچۆكا هاتن : دانیشتنە ئەژنۆ بۆ پێشەوە ؛ ئەندامی جنسی لە پیاودا ؛ قامیش .
لـە درێـژكۆلەییدا یـەك ئەگرنەوە .

**چۆلەكە** باڵیندە ؛ ئامرازێـكی جۆلاییە ؛ دوو پارچە تەختەی تەنكی باریكی كورتە جلی شۆڕاو بە تەنافەوە چەسپ ئەكات .
بە ڕواڵەت یەكن .

| | | |
|---|---|---|
| چەتاڵ | قـولاپ ، چنـگاڵ ؛ دەواری بچوك ؛ دار یا شیشێکی دوَ پەلە لوَلەی تفەنـگی ئەخرێتە سـەر لە کاتی تەقاندنا راوکەر بە کاری ئەهێنێت . | |
| چەخماخ | تفەنـــك . چەخماخســـاز : تفەنگساز ؛ چەخماخی جگەرە داگیرسان ، ئەستێ . | لە ئاگر و چەخماخەدا یەك ئەگرنەوە . |
| چەرخ | چەخماخ ؛ ماکینە ؛ دەم و سەدە . | لە خول خواردندا یەکن . |
| چەرخوفەلەك | جۆلانە ؛ دنیا و کارەسات . | لە هاتوچۆکەدا یەکن . |
| چەکەرە | گۆپکە : چرۆی درەخت ؛ کەڕوَ ؛ دوَدڵی و (شك) . | |
| چەقەنە | چەقەنەی ئاش ؛ چەقەنە لێدان ؛ درەختێکە بـەریك ئـەگرێت وەك بەری مۆرد . | |
| چەك | (سـلاح) ؛ خشڵی ژنانـ ؛ چەرمی پاژنەی کەلاش ؛ (صك : Check) . | بـە لای منەوە هەمـوو بنچینەدا یەکن ( صك ) نەبێت کە وشەیەکی بێگانەیە . |

| | | |
|---|---|---|
| چەماو | ترۆزیە چەمێلە ؛ چەم . | ترزیەکە لە چەمدا ئەکرێت بۆیە ئەو ناوەی بەسەرا سەپاوە . |
| چەمەرانە | دەهۆڵ و زورنایەکە لە شێوەندا ئەکوترێت ؛ شێوەنێکی دۆ دەستەیی پیاو و ژنە وەك ئەڵقەی چەمەرە ئەوەستن بۆ شێوەن کردن . | لە شێوەنەکەدا یەك ئەگرنەوە . |
| چەو | چاو ؛ کانییەکی رۆنی بەر تریفەی مانگە شەو .<br>لە بنیا بلەرزێ مرواری زیخو چەو . | رێکەوت . |
| چەورە | مرۆی بێشەرمی بەرەڵای هاروهاج ؛ دەسەسڕ . | رێکەوت . |
| چەورۆکە | دۆ جۆرە گیای بەهارین ؛ دەسرۆکەی بچۆك . | رێکەوت . |
| حەلەقمەلەق | قسەی پڕوپوچ و بێسەروپێ ؛ بەیتێکە لە کاڵە مستیدا ئەوترێ:<br>حەلەق مەلەق ، دەنوکی لەقلەق ،<br>کیسە و کەمەر ، یا پێغەمبەر . | قسەی پڕوپوچ . |

| | | |
|---|---|---|
| حەماڵ | کۆڵ کێش ؛ حەماڵی خاتو : نێرگەکەی . | لە هەڵگرتندا یەك ئەگرن . |
| خاراو | خاراوبونی چەرم : جێژبونەوەی لە ئاوا ؛ کوپەی خاراو : شتی شلی زۆر مژیوە ، تێربووە . | بە شت مژینەکەدا یەکن . |
| خاکە | خاکەی برنج و دانەوێڵە ؛ جۆرە مێشولەیەکی زۆر وردە . | لە وردییا یەك سەرچاوەن . |
| خاڵ | وەك خاڵی رەمەت و خاڵی کوتراو ؛ برای دایك (لالۆ) ؛ پەڵەی رەش بە هەرشتێکەوە ؛ (نقطە) ؛ بەفری زستان : کوێستانان خاڵ خاڵ بەفری ناچێتۆ . ئەو کچە منداڵە ، زیری نابێتۆ . | تەنها (خاڵ)ی (برای دایك) نەبێت ، هەموّیان یەك سەرچاوەن . |
| خان | شوێنی حەسانەوەی کاروانچی و وڵاخ ؛ رێزە بۆ ژن : گەلاوێژ خان ؛ (لەقەب)ی ئاغاکانی کوردستانی ئێرانە وەك : مەحموخان ، حەمە رەشید خان . | دوەم و سۆهەم بۆ رێزلرتن و یەکەم بێگانەیە و بە رێکەوت هاتووە . |

| | | |
|---|---|---|
| خلێنه | تۆپە بەنی متۆی رێسراو ؛ ئەو پیسی‌یەیە بە پاشـــەڵی مەڕەوە خڕ و وشك ئەبێتەوە . | بە خڕییەکەدا یەکن . |
| خڕ | شتی گرد ؛ شوێن لافاوە کە خڕە بەردی زۆر بێت وەك : خڕی چەناخچیان ؛ دەرگاکە خڕ دابخە واتا : کلۆمەکە بکە بە شوێنی خڕیدا . | |
| خشت | کەرپوچ ؛ رێك و پێك . | ( لە رێکیدا ) یەکن . |
| خەساندن | ئەسـپەکەیان خەساند : گونیان تەقاند و دەرهێنا ؛ شکاندن و لارکردنەوەی لقی گیای تەماتە تاکو پەل بڵاوکاتەوە ، بەرەکەی زۆر و باش بێت . | هـەر دوو ( عمـلیەتـەکە ) بـریتین لە شـکانـدنەوە و تەقاندنی ئەندامی گیان لەبەر . |
| خرس | ورچ ؛ مانگر . | مان گرتنەکەش یەکێکە لە خووەکانی مام ورچ . |
| خەملاندن | قەسراندن (تخمين) ؛ خەملینەوە : گەشانەوە . وا وەتەن خەملیوە وەك گوڵ نەوبەهاری میللەتە ، شادمانی قەومی کوردە وەختی لوتف و رەحمەتە . | |

| | | |
|---|---|---|
| داخ | خەم و خەفەت ، ( أسـف ) ؛ رۆن داخ کردن : هەڵقرچاندنی ؛ ولاخ داخ کردن : سـوتاندنی شۆینی ئازارەکەی ؛ شـاخ و داخ ( داغ ) . | |
| دادۆشین | دۆشـینی گوان ( بۆ ماڵات ) ؛ دادۆشینی ئەندامی لە جێ چوو : دەست پیاهێنانی لە ئاوی گەرما بە سـابون بۆ هاتنەوە جێی ؛ شت لێ کێشانەوە . | یەکەم و دوهەم لە دەسـت پیاهێنانەکەدا یەکن و یەکەم و سۆهەم لە شت کێشانەوەکەدا یەکن . هەرسێکیان لە بنەڕەتدا لە یەك سەرچاوەوە هاتون . |
| داکوتان | داکوتانی بزمار و مێـخ ؛ پراندن یاخود داوڵینی گەنم و جـۆ تاکو دانەکەی جیـا بکرێتەوە . | بە لێدانەکە هەردوك یـەك ئەگرنەوە . |
| داڵ | داڵی کەر خۆر : گۆشت خۆر ؛ هێشوە ترێی شاش ؛ گیانداری لاواز . | رێـکەوت . |
| دان | دانی نـاو دەم ؛ دانی ئەڵێی صەدەفە بەحری دەری هێنـاوە | لە قـەوارەدا نزیـکن لە یەکەوە . |

| | | |
|---|---|---|
| | پەلکەی ئەڵێی رەشمارە لە کون سەری کێشاوە ؛ دانەوێڵە : دەغڵ و دان ؛ دانی چێشت : بەرەکەی . | |
| داهاتن | داهێنانی دار بە مشار ؛ داهاتنی چاو : گڵ کردنی ؛ داهێنانی قژ ؛ تازە پەیدابوون و باوسەندن : تازە داهاتووە ئاوی بەلوعە ، پێموت بۆ ماچێ وتی مەمنوعە . | هەندێکیان بە رێکەوت یەکیان گرتووە . |
| دوکان | دوکان : کۆگا : شوێنی شت فرۆشتن ؛ خانەی ورد ورد لە زەوی شەتڵی تیا ئەڕوێنرێت . | لە ئەندازەی شوێندا نزیکن . |
| دەستگر | پەڕۆی داگرتنی مەنجەڵی گەرم ؛ ئەو کارەیە بەدەستەوە قورس بێت . | یەکن |
| دەستور | ( قانونی ئەساسی ) ؛ باو ، ( عادەت ) ؛ دەستور کرا : حوقنەیان کرد . | یەکەم و دووەم یەکن . |

| | | |
|---|---|---|
| دەفە | دەفەی شان : ئێسقانی بن قۆڵ ؛ دەفەی جۆلا : ئەو تەختــەیەیە تەزراوی پێ سفت ئەکات . | رێکەوت . |
| دەقدانەوە | کوتانەوەی برنجی نیوە کوتراو ؛ دەقی دایەوە : کوتای و کوزەرو بەربای عەمری دایەوە ؛ بێژانەوەی دانەوێڵە جارێــکی تر . | لە کوتاندن و پاك کردنەوەدا یەکن . |
| دەڵ | دەڵە سەگ ( مێیەکەی ) ؛ دەڵ ـ دەلاندن . | دەڵی سەگ لە گوانەکانیدا کون هەیە تونەڵەکانی شــیرەکەی لێوە ئەمژن . |
| رازان | ئامادە و ساز بون ؛ پاڵــکەوتن ؛ نوستن . | |
| راستە | راستەی هێڵ کێشان ؛ جۆرێکە لە هەڵپەڕکێ . | یەکن . |
| ران | رانی مــەڕ : گەلە مەڕ ؛ رانی مڕۆ ، ئاژاڵ ، ولاخ .. | رێکەوت . |
| رایەڵ | حــــەماڵ ، نیرگە ؛ چەنـــــد هەودایەکی راستە کە پۆی شتی لەسەر ئەتەنرێت . | یەکن . |

| | | |
|---|---|---|
| رزق | مشکی گەورەیە کە بەزۆرێ لە دەشتایە ؛ دانەوێڵە و خواردنی هەڵگیراوی ناوماڵە . خـوا رزقت بدا : واتا ئەو شتانەت بداتێ . | مشکی رزقیش هەر لە رزق خواردنەوە ناو نراوە . |
| رست | رستی هۆنراوە ؛ تەناف ؛ پەت یا قایشی درێژ تـانجی راوێ پێ ئەبەسرێتەوە لە کاتی راودا . | هەمـوێ لە بەسـتنەوەوە هاتووە . |
| رۆژ | ( خۆر ـ شمس ) ؛ ( شەو و رۆژ ـ لیل ونهار ) ؛ کات : دەم : ئەم رۆژە چ رۆژێکە کە دنیـا شڵەژاوە ، هەرکەس بە جەخارێ جگەری قیمەکراوە . | |
| رەحەتێ | رەحـەتێ نەوت : قمـع ؛ حەسـانەوە ؛ خاو بونەوە دوای دروست بون . | یەکەمیان هۆیەکە بۆ تێکردنی نەوت بە ئاسانێ ، دوانەکەی تر یەکن . |
| رەشکە | رەشکەی کاکێشان ؛ رەشکە و شملێ : دانەوێڵەی بۆنخۆشن ئەکرێنە ناو نانەوە بۆنی خۆش . | تۆ بڵێی بەهۆی رەشیەکەوە ناوەکەیان بەسەردا سەپابێ . |

| | | |
|---|---|---|
| رەشبۆنەوە | دامردنەوەی ئاوڵە و سورێژە ؛ چۆنەوەی بەفر و تواندنەوەی ؛ کوژانەوەی ئاگر . | هەمۆ لە بنچینەدا یەکن . |
| رەشبەڵەك | دەست گرتنی ژن و پیاو لە هەڵپەڕکێدا ؛ رەش و سپی . | بە تێکەلاوبۆن یەکن . |
| رەشمە | رەشمەی وڵاخ ؛ خشڵ . | یەکن . |
| رەند | مرۆی رۆخۆش و قسە خۆش ؛ زەمینێکە لە ناو چەمدا بەهۆی ئاو هەڵسانەوە پەیدا ئەبێت . وەك رەندی حەسەن ئەفەندی لە کوێ چەمی تانجەرۆ . | رێکەوت . |
| رەندە | رەندەی دارتاش : تەختەی پێ پوخت ئەکرێت ؛ رەندەی پەنێر : پەنێر و شتی تری پێ ورد ئەکرێت ؛ رەنە : قرتاندنی کوڵی مەرەزە . | هەمۆیان لە رێشەدا یەك ئەگرن . |
| رەوە | رەوە وڵاخ ؛ لێسێکی گەورەیە گەزۆی پێ ئەتەکێنرێت . | رێکەوت . |
| رێخ | زێخ و وردە چەو ؛ پیسی ئاژاڵ . | لە نبشتندا یەکن . |

ریپۆق
چڵـکی چاو بە وشکتی ؛ چڵمی وشکەوەبۆ لە لوتدا .
یەکن .

ڕێژاو
جۆرە هەنجێریکی بەناوبانـگە ؛ تاڤـگە ؛ قەڵبەز .

زار
دەم ؛ زاری تاوڵە ؛ زار و گریە.
زاری تاوڵەکە بێگانەیە .

زبان
لسان ؛ لغە .
لەقسەوەیە بـــە جوڵاندنی زمان .

زرنگانەوە
زرنگەی پاوانە و پلێلـــــە و ســـاجلەخ و جام : جام ئەڵێ بشـکێم ونەزرنگـــێم[18] ؛ زرنگانەوی گوێ : گوایا گوێ بانگی ئـــەکات ؛ کزربونەوەی شتی تەڕ .
دەنـگدانەوە هەندێکیان یەك ئەخات .

زەرد
ڕەنگی زەرد ؛ زەردەی خۆر ؛ ( نحاس ) .
لـە بنچینـەدا یـەکن ( لەرەنگدا ) .

زیخ
زیـخ و چەو ؛ ئازا .

زەردویی
مۆروی دەست و ملی ژنان ؛ نەخۆشی زەردویی .
لــە بنچینـەدا یـەکن ( لە رەنگدا ) .

---

(١٨) بەندی پێشینان .

| | | |
|---|---|---|
| زەل | زەلی گوێی چەم و ئاو ؛ قوڕی ڕەش ؛ جگەرەی قامیش . | بێجگە لە قوڕەکە ئەوانی تر لە درێژیدا یەکن . |
| زیقاوڵە | مەلێکی ســـووریاوە لە کۆتر بچـوکتر ، لە نیشـــتنەوەدا ئەزیقێنێ ؛ گیاندارێکی بۆری چوار پێیە لە دەڵەک گەورەترە و پێستی بەنرخە . | لە دەنگدا یەکن . |
| زێ | (نهر) ؛ زێی ئافرەت (رحم) . | یەکن ، (ئەو شوێنەی ئاوی لێ دێ) . |
| سوور | ڕەنگ : من ڕەنگی سوورم بۆیە ڕێکەوت ، خۆش ئەوێ . مژدەی شەفەقی لێ دەرئەکەوێ ؛ سوێر ؛ سوور ـ بوون لەسەر را . | |
| سوورمە[19] | قوماشی سیمدار بۆ جلی ژنان ؛ کل : ســـوور و سپی سوورمە لەچاو[20] . مەحوە فەندی کاکی حەلاو . | |

(١٩) سوورمە بە تورکی پیاهێنانە ، کل و کلتوریش بە چاودا ئەمێنرێن .

(٢٠) پەندی پێشینان .

| | | |
|---|---|---|
| سێ | (٣٠ ، ژمارە) ؛ (رنە) . | رێکەوت . |
| سەیوان | چەتر ؛ خێودت . | یەکن . |
| سێلە | سەرسوچی کۆلان[٢١] ؛ سێلەی رەحم (صلة الرحم) ؛ رەققە . | |
| سەوڵ | سەوڵی بەلەم و کەلەك ؛ گیایەکی بەرزی کەلاپانە ، گوڵێکی سوور ئەگرێت وەك پۆپنەی کەڵەشێر ؛ داری سەرو . | بێگانەن و بە رێکەوت یەکیان گرتووە ؟ |
| سێپا | سێ کوچکەی سەرئاگر ؛ سێداری بەستراون بەیەکەوە ، مەشکەی پیا هەڵئەواسرێت بۆ ژەنن . | یەکن . |
| سیخوڕ | جاسوس ؛ پێستی ناو سکی ئاژاڵ ، ریخ ؛ سوچەر . | رەنگە هەبە لە پیبیەکەدا یەك بن . |
| شاخ | کێو ؛ شاخی ئاژاڵ . | لە رەقی و رەنگدا نزیکن . |
| شانە | شانەی قژ داهێنان ؛ شانەی هەنگ ؛ سەرکار (بادیناتی) . | شانەی قژ و هەنگوین لە دانە دانەکەیاندا یەکن . |

(٢١) سیلەی کۆلان (صله) ، دوو کۆلان بە یەك ئەگەبەنێت .

| | | |
|---|---|---|
| شاگرد | قوتابی ؛ شاگرد دارتاش ... | یەکن . |
| شکار | راو ـ شکار ؛ کۆمەڵە بەرد ؛ زەوی بەردەڵان . | راویش لە شوێنی بەردەڵاندا ئەکرێت ! |
| شەڵاخ | زللە ؛ قامچی . | لە لێداندا یەك ئەگرن . |
| شوشە | قاپ : بطل ؛ شوشەی پەنجەرە : جام . | یەکن . |
| شێ | کەزو : (رطوبة) ؛ وڵاخی شێ : سوورباوێکی کاڵ . | رێکەوت . |
| شیر | شیر و ماست (حلیب) ؛ تیغ . | ئایا رەنگ نزیکیان ناخانەوە ؟ |
| شەوق | روناکی ؛ ئارەزو . | |
| شەوە | بەردی بەنرخ : شەوە رەشە ، شیلان سورە ، شۆربا شلە ... ؛ مۆتەکە . | کە شەوەش یەکێك ئەگرێت شێت یاخود رەش هەڵئەگیرسێت ، چونکە خوێن ناجولێت . |
| غەزەل | ئاوریشمی مێل مێلی رەنگاو رەنگە وەك شیرداخ ؛ شیعری دلداری . | لە (غزل)ەوە هاتون کە تەونە . |

| | | |
|---|---|---|
| فاتەبۆرە | جۆرە کاڵەکێـکی پێست رەشە ؛ جۆرە گیایەکی گەڵا پانە وەك کاڵـەك بەرێـکی درێژکۆڵەی شیرین ئەگرێت . | لە رەگەزدا یەکن . |
| فت | وشەیەکە لە یاری کڵاوێن دا بەکار ئەهێنرێت وەك : فت ، فت .. دەستەگوڵ ؛ فت کردنی سـەبیل : فزێدانی توتنـە سوتاوەکەی . | لە رەگەزدا یەکن |
| قاپوت | پاڵتۆ ؛ وەرگرتنی سێ خاڵە لە یاری ئەسکەملدا بە کاغەز ، یەك خاڵ ئۆینە ، دوَ خاڵ مەرزە . | بێگانەن . |
| قاش | قاشی کاڵەك و ترۆزی .. ؛ برۆ ؛ قاشی ئافرەت : حـەز لەیەك کردنیان . | یەکگرتن و جـوت بوَن یەکیان ئەخات . |
| قاڵب | بەدەن ، وەك : رأس سەرە ، عین چاوە ، بدن قالب ، اسم ناوە[22] ؛ قاڵبی کولیچە و کاڵ کاڵی . | قاڵبی بەدەن ئەو ( هیکل )ەیە کە گۆشت و خوێنی تیایە ، لەگـەڵ قاڵبی تردا یـەك ئەگرنەوە . |
| قەبز | توندبوَن و دەرنەچوَنی سك ؛ تەنگ ـ کئیب . | لە ( قبض )ی عەرەبییەوەیە و تەنگی ئەگەیەنێت . |

(٢٢) ئەحمەدێ ، شێخ مارفی نۆدێ ، رەواندز ، ١٣٤٥ك ، ل٢ .

| | | |
|---|---|---|
| قۆپیە | كاغەزی كاربۆن ؛ ( غش ) . | بێگانەن ( Copy ) بەكیان ئەخات . |
| قۆخ | مێوە ؛ كۆخت : كوخ . | رێكەوت . |
| قۆڵ[٢٣] | باڵی مرۆ ؛ ئێشكگر : دوریة ؛ ( طرف ، جهة ) . | بێگانەن ( توركی ) . |
| كار[٢٤] | كار ـ ژۆلە ؛ ئیش ؛ تیَن . | كاری كارژۆلە نەبێت ئەوانی تر بێگانەن ، ( توركی ) . |
| كاژ | پێستی مار كە هەڵی ئەدا ؛ داری سنەوبەر . | دارەكەش توێكل هەڵ ئەدات . |
| كاشی | قاپی چێشت : ماعون خزفی ؛ خشت كە تەختی ناو ماڵی پێفەرش ئەكرێت . | رووە لوسەكە بەكیان ئەخات. |
| كناچە | پۆر ؛ كچ . | رەنگ هەیە جوانی بەكیان بخات . |
| كنر | كنر (كاعوب) : كنر و ماست بۆ وەعدەی خۆی[٢٥] ؛ دەزرَ . | رێكەوت . |

(٢٣) سەیری قاموسی توركی ئۆكسفۆرد ل ١٩٦ ، بكە .

(٢٤) سەرچاوەی پێشوَ .

(٢٥) پەندی پێشینان .

**کۆ** ئەستێرەی کۆ ؛ کۆی زوخاڵ ؛ کڵۆکۆ ؛ کۆ — کردنەوە : گردکردنەوە . — ڕێکەوت .

**کوڵ** کورتە بنە ؛ مریشکی کوڵ : بێ‌کلك ؛ کوڵ ـ ی چێشت . — ڕێکەوت .

**کۆلارە** باڵینده : کۆلارە ، جوجك مەخۆ بەهارە[٢٦] ؛ کۆلارەی کاغەز کە منـاڵ هەڵی ئەدەن بە ئاسماندا . — بەکن .

**کوللە** پەردەکوللە ؛ ( جراد ) . — کوللەی پەردەکە نورکییە .

**کۆم** چەماوە ، قەمتور ؛ ( مخرج ) . — ڕێکەوت .

**کۆك** ڕێك ، تـەواو ؛ کۆك‌گرتنی جل : دروَمانی ( موقت ) . — بەکن .

**کتۆر** سست بونی جەستەی بەدەن ( کتور بون ) ؛ شـاخی کتۆر : سەخت و نارەحەت ؛ چەماوە . — سەرکەوتن بە شاخی سەختدا نوشتانەوە و مانـدو بونی ئەوێت .

**کیف** بەرگی دەمانچـە و تفەنـگ لە چەرم ؛ کیفی پارە : جزدان ، کیسە . — بەکن .

(٢٦) قسەی منالان .

| | | |
|---|---|---|
| کەژ | کێو : کەژ و کێو ؛ (فصل) . | |
| کەل | لێو خوراو : کەلەفیچ ؛ لەکەل دەرکەوتی بناسە دەنگم — تۆزی غەریبی نیشتوە لە رەنگم . | رێکەوت . |
| کەڵەك | بەردی وشکە سی لەسەریەك ؛ ساختە و لە خشتە بردن ؛ بەڵام : کەڵەکی یاسین ئاغا . | رێکەوت . |
| کەمەر | ناو قەد ؛ بەرد . | رێکەوت . |
| کەو | باڵندە : بازە کەو ، ئێرەکەو ؛ لە بابەتی هێلەك ، کونەکانی گەورە ترە . | رێکەوت . |
| کەوانە | کەمانچە ؛ (زاویة) . | |
| کەوە | بۆر ؛ (دائرة) . | |
| گاز | گاز — گرتن بە دان ؛ گازی بزمار دەرهێنان ؛ گازی پشت ؛ گاز — کردن : بانگ کردن . | رێکەوت . |

| | | |
|---|---|---|
| گاڵ | هـەرزن ؛ گاڵ — دان : راسپاردن بە هەڕەشـەوە ؛ گاڵەگاڵ : دەنـگە دەنـگ . | گاڵدان و گاڵە گاڵ بەکن . |
| گڕ | گڕی ئاگر ؛ مرۆی گڕ : ئەو کەسەیە دانەکانی پێشەوەی گەورە بێت ، گڕخواردن : سوڕانەوە . | رێکەوت . |
| گرد | (تل) : گردی مامە یارە[27] ؛ کۆ : کۆمەڵ : (جمـع) ؛ گرد — یلە : خڕیلە . | رێکەوت . |
| گۆ | سـەرگۆن : قۆی ئاڵۆزکاو و دانەهێنراو ؛ زاراوێـکە بەرامبەر بە رەشـــە ولاخی تۆڕ بەکار ئەهێنرێت لە کاتی هەڵتیزاندنـدا ؛ بە گۆدا چۆن . | |
| گل | ئێشقی چاو ؛ گلان — گلاندن : کـەوتنی ولاخ و بەربوونەوەی سوار . | |
| گلێنە | دانەوێڵە : رەگ بە رەگێشە و گلێنە بەبنە تۆو[28] ؛ گلێنەی چاو . | لە یەك ئەچن لە رەنگدا . |

(٢٧) ئەکەوێتە رۆژهەلاتی سلێمانی .
(٢٨) پەندی پێشینان .

| | | |
|---|---|---|
| گۆ | مـــوورۆی زەردی گەورە ؛ گۆ — ی شەقێن : تەختەیەکی خڕی بچوکە وەك تۆپ لە یاری شەقێندا بەکارئەهێنرێت . | خڕییەکە یەکیان ئەخات . |
| گۆت | گۆت بوون ، سست بوونی جەستە ؛ گۆت ـ لێدان : تەوژم و پاڵ وەك : لە یاری یەکە و گۆتەکە و گوژمی چەرخ و فەلەکدا هەیە . | گۆت بو : لە تەوژم کەوت، گۆت لێدان : تەوژم دانە . |
| گۆشە | لە سـەرێن بچوکتر ؛ زاویة : کەوانە . | یەکن . |
| گەڕ | نەخۆشتی پێســـت ؛ گەڕ — پێکردن : بیانو پێ گرتن ؛ کەوتنـــەوە گەڕ : دەســـت پێکردنەوە . | رێکەوت . |
| گەلاوێژ | ئەستێرەی گـەلاوێژ ؛ مانـگی گەلاوێژ : تەمووز : تیرماهێ . | ( فلـکیات ) یەکیان ئەخات . |
| گەمە | یاری ؛ گاڵتەپێکردن ( استهزاء ) . | یەکن . |
| گەنج | پـارە و سـامان : گـەنجی قارۆنی هەیە ؛ هەرزەکار . | |

| | | |
|---|---|---|
| لاله | ئاوێزه ؛ لالۆ ( خاڵ ) . | رێكەوت . |
| لەواشه | كولێرەی تەنك و درێـژ ؛ له واشـەی لـۆزی ولاخ : وەك مەقاش وایه له تەختـه ، لۆزی پێ ئەبەستن له كاتی ناڵ كردندا . | رێكەوت . |
| مانـگ | ( قـــر ) : مانـگ دیاره چ حەوەجەی به ئەموسته[29] ؛ شهر . | ( فلكيات ) یەكیان ئەخات . |
| مایه | گـۆشەیەكه له نانـ پێوەداندا بەكار ئەهێنرێت ؛ مایه : ماڵ : سەرمایه . | رێكەوت . |
| مڕ | تێر ؛ مڕ ـ اندن : مڕەی سەگ پێش وەڕین . | |
| مرۆ | مرۆڤ ؛ هەرمێ . | گۆڕانی شێوه . |
| مز | حەق : ماف ؛ ( رصاص ) مز : مامز : ئاسك . | رێـكەوت . |
| مۆ | تاڵێك له قژی سـەری مرۆ ، مۆی بزن ؛ گرێیـەكه وەك دومەڵ له دەست و قاچ دێت . | رێـكەوت . |

(۲۹) پەندی پێشینان .

| | | |
|---|---|---|
| مۆر | (طمغه ، مهر ، ختم) ؛ ڕەنگی بنەوشەیی . | مۆری (مهر) بە ڕەنگی مۆر کاغەز مۆر ئەکات (یەکن). |
| مۆم | (شمعه) ؛ داری ترێ . | گۆزانی شێوە . |
| ناڵ | ناڵی وڵاخ ؛ ناڵ — اندن ناڵەناڵ . | |
| ناو | (اسم) : یەك هەر خوادیە ، تاك و تەنهایە ، ناوی ئەڵڵایە[30] ؛ (داخل) ناوئاخن ، ناوجەرگە. | (اسم)ەکە نەبێت ئەوانی تر یەکن . |
| ناوك | (صرة) ؛ (نواة) . | یەکن . |
| نۆ | ژمارە ، (٩) ؛ نۆ ، نو ، نوێ ، نۆبەرە . | ڕێکەوت . |
| نیشانە | (نوط) ؛ خاڵ بە بەژنی مرۆوە؛ نیشانە کردن : دیاری کردن وەك نیشانەی بتوك . | یەکن . |
| وار | شوێن : ئەو وارە ، نەڕێـەو بەهارە[31] ؛ واری قومار : باج سەندن لە یاری کەران . | واری قومار بێگانەیە . |
| واڵا | خۆشك ؛ واڵای منداڵ : ئەو | گۆزانی شێوە . |

(٣٠) فۆلکلۆرە ، لە پێواندا ، لەکاتی سوڕبوونی خەرماندا ئەوترێ .
(٣١) پەندی پێشینان .

| | | |
|---|---|---|
| | سەرە پارچانەن لە قوماش کە منداڵ یارییان پێ ئەکەن . | |
| وەجاخ | وەچە، بنەماڵە وەك: وەجاخ زادە بە ئیشارەت، ناوەجاخ بەکوتەك[٣٢] ؛ وەجاخی چایخانە : ئەو شوێنەیە کە چای تیا لێ ئەنرێت . | وەجاخی چایخانە بێگانەیە . |
| هێڵ | خەت ؛ شوێن گاسنی جوتیار لە کاتی جوتدا . | یەکن . |
| هەڵهاتن | راکردن و خۆدەربازکردن (کلاّفە کردن ) ؛ هەڵهاتنی هەویر ( تخمر ) . | گۆڕانی شێوە . |
| هەڵهێنان | هەڵهێنانی هێلکە : بوونی بە جوجەڵە ؛ هەڵهێنانی مەتەڵ : دۆزینەوە و زانینی . | یەکن . |
| هەوا | با ؛ هەوای بەرزە : لوتی لە ئاسمانە ؛ هەوردا دەزوَ . | بێگانەیە . |
| هەور | ( غیم ) هەوری پایز خۆری ، دەوڵەمەند ریشی‌خوی بڕی[٣٣] ؛ اسفنج . | ( اسفنج ) بێگانەیە . |

(٣٢) پەندی پێشینان .

(٣٣) پەندی پێشینان .

# ـ ملخص المقال ـ

# بعض المصطلحات الكردية
# التي
# لها اكثر من مدلول

العضو المؤازر : جمال بابان

بالرغم من سعة اللغة الكردية ووفرة مصطلحاتها ، الا انها اطلقت بعض الاسماء على شيئين ( او اكثر ) كانا متباعدين اصلا او من اصل واحد الا انهما ابتعدا بصورة تدريجية . ولهذه الظواهر اسباب عديدة اهمها :

١ــ عوامل تأريخية : لا يستبعد ان يكون اصل المصطلحات او الكلمات واحداً ثم تشعب بمرور الايام وتباعدت الفروع عن بعضها .

٢ ــ عامل الصدفه : هناك أصطلاح واحد اطلق على مسميات عديدة عن طريق الصدفة . وقد ثبت كل اسم وتركز واصبح

شيئاً مألوفا ، مثل : ( كەو ) وهو ( طير الككلك ) و ( كەو ) (وهو الشبيه بالمنجل ويستعمل لتنظيف الحبوب من المواد الغريبة) .

٣ — المصطلحات الدخيلة : هناك بعض الكلمات الغريبة دخلت اللغة الكردية وهي كلمات عربية او فارسية او تركية . . فأخذت مكانها واعتاد الناس استعمالها وفي عين الوقت توجد نفس الكلمة باللغة الكردية الا ان مدلولها يختلف اختلافاً كليا عن مدلول الكلمة الدخيلة مثل (اذار) وهو الشهر الثالث من السنة الشمسية عند العرب وقد حرف الى ( ازار ) باللغة الكردية . وفى نفس الوقت توجد كلمة ( ازار ـ ئازار ) وهي كلمة كردية اصيلة وتعنى الالم . وتسمى هذه الظاهرة بـ (الكلمات المشتركه لفظاً HOMONYM ) ويقول الدكتور عبدالرحمن معروف بهذا الصدد : « ان هذه الكلمات لا تدخل في نطاق ( الكلمات المتعدده المعنى ) . صحيح انها كلمات مشتركة عند القراءة والكتابه الا انها مختلفه في التكوين وفي المعنى » . ثم يضرب مثلا لذلك فيقول : « ان كلمة (باو) لها معاني عديدة مختلفة كما ان نشوئها وتكوينها جاء في فترات مختلفة او متباعدة بالرغم من كونها جميعاً كردية أصيلة فـ (باو) تعنى ( العادة والعرف والدستور ) وتعنى (باوك ـ الاب) وتعنى ( تفضيل شيء على غيره ) »[1] .

---

(١) راجع البحث الذي قدمه الدكتور عبد الرحمن معروف ( الحلقة الدراسية للكتاب المدرسي باللغه الكردية المنعقدة في شقلاوه ) ، بتاريخ ٢٥ـ١٩٧٣/٧/٢٧ .

٤ – تعدد اللهجات : مثل كلمة (شواشينك) التي هي شجرة دائمة الخضرة واوراقها تشبه الـ (ياس) ويطلق نفس الكلمة في منطقة البهدينان على نوع من العنب وعلى نوع من التين ايضاً . كما ان (چاى) تعنى في اللهجة اللرية (سارد ـ بارد) وفي اماكن اخرى تعني الشـــاي .

هناك اسباب اخرى : فنرى اتحاد بعض المصطلحات عن طريق الاختصار والادغام أو عن طريق تركيب الكمات او . . .

اني في الوقت الذى اجمع فيه المصطلحات من هذا النوع منـذ مـدة غير قصيرة الا انني اعتمـدت هنا الى حـــد بعيد على معجم الخال ومن ثـم على معاجم الشـــيخ معروف القرهداغى والاستاذ توفيق وهبي وادموندس والمردوخ والمرشـــد (رابەر) . . . وتســـهيلا للفهم قمت بشـــرح معاني بعض الكلمات او ضربت لها امثال دارجـة او فولكلوريـة ومن ثـم فأننى تطرقـــت الى تأويل وشـــرح العلاقة بين المدلولات حسب رأي الشـخصي ، فلا يستبعد ان اكـون صائباً او مخطئـاً . وفي الحالـة الاخيرة ارجو العون من القارىء الكريـم وذلك بمساعدتي في التصحيح في الاعداد القادمة خاصة وان هذا البحث هو الاول من نوعه تقريباً .

* * * * * *